بسم الله الرحمن الرحیم

## ناسنامەی کتێب


ناوی پەرتووک: چۆن منداڵانمان فێری بیروباوەڕی ئیسلامی بکەین

نووسین و ئامادەکردنی: ڕەنجدەر کوردی

نەخشەسازیی ناوەوە: عبداللە خاکی

نەخشەسازیی بەرگ: عوسمان محمد

شوێنی بلاوکردنەوە: حاجی قادری کۆیی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٤ کۆچی – ٢٠٢٢ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی
ساڵی «٢٠٢٢»ی پێ دراوە.

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم

إنَّ الحَمْدَ لله نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ بالله مِنْ شُرورِ أنْفُسنا ومنْ سَيِّئات أعْمالنا، مَنْ يَهْده اللهُ فَلا مُضلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلل فَلا هاديَ لَهُ. وأَشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأَشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْس واحدة وخَلَقَ منها زَوجَها وبَثَّ منهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديدَاً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصَدَقَ الحَديث كتابُ الله، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمد صلى الله عليه وسلم، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ

## ئەم نامیلکەیە پێشکەشە بە:

- ✿ مامۆستا فێرخوازەکان.
- ✿ خوشکان و برایانی بانگخواز.
- ✿ دایکان و باوکانی پەروەردەکار.
- ✿ گەنج و لاو و منداڵە چاوگەشەکانی ئیسلام.
- ✿ سەرجەم موسوڵمانان لە هەر کوێ بن.

# پێشـەکی

پاش سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ أللە ی بەرزو بێ هاوتا و خاوەنی بوونەوەر، درووودو سڵاوی أللە سبحانە وتعالی لەسەر پێغەمبەری خۆشەو یستمان (محمد) ﷺ و یارو یاوەرانی بێت تا ڕۆژی دوایی،

لە پاشان دا:

ئەم نوسراوەی بەردەستتان بابەتێکی گرنگە کە لە سەر چۆنییەتی پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵەکانمان لەسەر بیروباوەڕی ئیسلامی ڕەسەن کەهەردوو پایەکانی ئیمان و ئیسلامی لەخۆ گرتووە بەکورتی بەپێی تێگەشتنی گەنج و لاوەکان و مناڵانی ئازیزو خۆشەویست.

وە هیوادارم ئەم نامیلکەیە سەرەتایەك بێت بۆ فێربوونی بیروباوەڕی ڕاست بۆ گەنج و لاوەکان و منداڵە چاو گەشەکانمان و مامۆستایان و بانگخوازان و فێرخوازان لەم ڕێیەوە بتوانن وانەکانی بیروباوەڕی ڕاست بەشێوازێکی کورت و پوخت بۆ نەوەی دووارۆژی ئیسلام ڕون بکەنەوە.

دیارە پەرتوکەکانی بیروباوەڕ گەلێك زۆرن،منیش حەزم کرد لەسەر شێوەی نامیلکەیەکی بچوك بیخەمە بەردەستی منداڵانی باوەڕدار کە خۆیان بتوانن بە ئاسانی لەبیروباوەڕەکەیان شارەزابن.

ئومێدەوارم ئەمە وەك سەرە تایەکی گرنگ بێت کە منداڵان بۆ خۆیان بە هیممەتی خۆیان لەپاش فەزڵی ألله سبحانه وتعالی لەم پلیکانەیەوە سەرکەون بەرەو لوتکەی بیروباوەڕی ڕاست و ڕەوانی ئەهلی (سوننەو جەماعة).

بەو هیوایەی جێگای ڕەزامەندی ألله سبحانه وتعالی بێت و پاشان ئێوەی بەڕێزیش سودمەند بن لێی، وە دەپاڕێمەوە بەوپەڕی ملکەچیمەوە کە ألله سبحانه وتعالی لەسەرجەم لەهەڵەو کەم و کورت یەکانمان ببورێت و پاداشتی خێری سەرجەم ئەو زاناو بانگخوازو مامۆستایانەش بداتەوە کەسودم لەوانەو پەرتوك و نوسراوەکانیان بینیوەو ئەم نامیلکەیەشمان بەنیەتێکی پاکەوە بۆ بکاتە سەرتەرازوی چاکەکانمان لەڕۆژی دوایی دا.(اللهم آمین)

ڕەنجدەر کوردی
٢٩ ی شەوالی ١٤٤٢ی کۆچی
بەرامبەر
١٠ . ٦ . ٢٠٢١ ی زاینی

# بەشی یەکەم

# (پایەکانی ئیمان)

## پێناسەی ئیمان

ئیمان (باوەڕ): واتە، بەڕاست زانینە بەدڵ و بڕیاردانە بەزمان و کردارە بەئەندامەکانی لاشە.

وە هەروەها باوەڕ،گوفتارو کردارە

بەمانای گوفتاری دڵ و زمان، کرداری دڵ و زمان و ئەندامەکان.

گوفتاری دڵ: بریتییە لە دان پێدانان.

کرداری دڵیش: بریتییە لەتەسلیم بوون و نیەت پاکی و مل کەچ بوون و خۆش ویستنی کردەوە چاکەکان.

کرداری زمان و ئەندامەکانی لاشەش: بریتییە لەبەجێهێنانی فەرمانەکان و دوورکەوتنەوە لەقەدەغە کراوەکان.

## سیمای ئیمانی ڕاستەقینە دەبێت بەم شێوەیە بێت

یەکەم: دەبێت مرۆڤ تێگەشتنی ژیرانەی هەبێت کە بەهۆیەوە پەی بەڕاستییەکانی ژیان و بونەوەر ببات.
دووەم: دەبێت ئەو تێگەشتنە ژیرانەیە بگاتە ڕاددەی دڵنییای تەواو بەجۆرێك هیچ گومان و دوو دڵی یەك لە دڵ و دەرونیدا نەهێڵێت.
سێیەم: دەبێت ئەو تێگەشتنە ژیرانەیە ی کە مرۆڤ قەناعەتی پێ یەتی هاوڕێ بێت لەگەڵ مل کەچی و گوێ ڕایەڵی و پابەند بوون بە ڕێنمایییەکانی ألله، وە پاشان پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ.
چوارەم: دەبێت ئەو تێگەشتنە دامەزراوە و ئەو مل کەچی یە تەواوە هەست و سۆزیکی گەرم و بەتینی لەگەڵ دا بێت کەوا لە مرۆڤ بکات بەپێی داخوازی ئیمانەکەی مامەڵە بکات.
باوەڕ بوون بەغەیب: واتە: باوە ڕ بوون بە شتانێك کە نادیارو شاراوە و پەنهان بێت و هەموو ئەو شتە نهێنی یانەی کەخوای گەورە لەڕێگەی(سروش) وەحی بە جبریل (علیە السلام)دا ناردویەتی یە خوارە وە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.دەبێت ئێمەش باوەڕمان پێی بێت و بەڕاستییان بزانین و هیچ شك و گومانمان نەبێت بەرامبەری وەك: ڕوداوەکانی دوای مردن زیندوو بوونەوەو حەشرو حیساب و پردی صیراط و بەهەشت و دۆزەخ هتد.. وە پایەکانی ئیمانیش هەموویان لە شتە شاراوەکانن وەك لەمەو پاش دێینە سەری.

## پایەکانی ئیمان(باوەڕ)

یەکەم: باوەڕ هێنان بە(أَللە).

دووەم: باوەڕهێنان بەفریشتەکان.

سێیەم: باوەڕهێنان بەکتێبە ئاسمانییەکان.

چوارەم: باوەڕهێنان بە پێغەمبەران.

پێنجەم: باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی.

شەشەم: باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر خێرو شەڕی.

### پایەی یەکەم: باوەڕهێنان بە(أَللە)

واتە: ناسینی خوای گەورە بەجوانی و بەتەواوی و وەکو چۆن خۆیی و پێغەمبەرەکەی ﷺ.باسییان کردووە و وەسفیان کردووە، پاشان یەکتایی ئەو بکەن لەهەموو جۆرە پەرستنێکدا، وە هیچ هاوەڵ و هاوتاو هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدەن.

وە دەبێت باش بزانین کەخوای گەورە نە نێرە نەمێ یە وە نە دەخوات و نەدەخەوێت و نە وە نەوزیش دەدات بەڵکو بیسەرو بینایە بەڵام چۆن ئەوە تەنها خوای گەورە بۆ خۆی دەزانێت وە دەبێت باوەڕمان وا بێت کەوا خوای گەورە (إستواء)ی کردووە لەسەر عەرشەکەی وە عەرشەکەی لەسەر ئاوە، ئاوەکەش لەسەرووی حەوت چینی ئاسمانە وە دەبێت باوەڕمان وابێت کەوا عەرش خوای گەورەی هەڵنەگرتووە ،

وە خوای گەورە کورسی تایبەتی خۆی هەیە کە جێگەی پێی خوای گەورە یە وە چۆنی یەتی یەکەی تەنها خۆی دەزانێت و نابێت هیچ بەخەیاڵماندا بێت یاوە خوود خواپەنامان بدات بیشوبهێنین بە دروستکراوەکانی خوای گەورە چونکە هەرکەسێك باوەڕی وا بێت و بەڕاستی بزانێت کەوا خوای گەورەش وەك مرۆڤ یان هەرشتێك کە شەیطان بەخەیاڵدا دەیهێنێت و دەیبات ئەوا بە تێکڕایی زانایان پێی کافرو بێباوەڕ دەبێت.

بۆ ناسینی خوای گەورەش کۆمەڵە ڕێگایەکمان هەیە کە بتوانین زیاتر گەورەیی خوامان بۆ دەربکەوێت لەوانە:

یەکەم: سەرنجدان لە دروستکراوەکان و ژیان.

دووەم: سەرنجدان لە توانایی بێ سنوری(ألله) سبحانه وتعالی.

سێیەم: سەرنجدان لە زانیاری گشتبینیی (ألله) سبحانه وتعالی.

## یەکخواپەرستی (التوحید)

بریتییە لە بەتەنها ناسینی خوای گەورە لە پەروەردگاریەتی و پەرستراویەتی و ناوسیفاتەکانیدا، وە زانایانی ئیسلام یەکخوا پەرستی ألله یان کردووە بە سێ بەشەوە.

### یەکەم: یەکخواپەرستی پەروەردگاریەتی(التوحید الربوبیة).

واتە: بەتەنها ناسینی خوای گەورە لە کارو فەرمانەکانیدا وەك:دروست کردن و خاوەنی یەتی و مشورخواردن و ژیان و مردن و ڕۆزیدان و سود گەیاندن و زەرەر گەیاندن و... هتد.

لەم جۆرەی یەکخوا پەرستی دا ئەو کەسانەشی کەهاوبەشیان بڕیارداوە بۆ خوای گەورە هاوڕان لەگەڵ یەکخواپەرستان دا و، باوەڕیان وایە کە خاوەنیەتی و مشورخواردن و ژیان و مردن و ڕۆزیدان و سودو زەرەرگەیاندنیش هەر بەویستی (ألله)یە سبحانە وتعالی، بەڵام لەگەڵیدا هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن.

**دووەم: یەکخوا پەرستی پەرستراویەتی(التوحید الأولوهیة).**

**واتە: بەتەنها ناسینی خوای گەورە لە پەرستندابە هەموو شێوەکانی یەوە وەك: نوێژو ڕۆژوو زەکاتدان و حەج کردن و قوربانی دان و پاڕانەوەو تکاکردن و ملکەچی و شوێن کەوتن و... هتد.**
**دیارە ئەمیش بەوە دەبێت کە واتای پەرستن بزانین.**

**سێیەم: یەکخواپەرستی ناوو سیفاتەکان (التوحید الأسماء و الصفات).**
**واتە: باوەڕ بوون بەوەی کەخوای گەورە خاوەنی هەموو سیفەتێکی تەواوە و دوورە لە هەموو سیفەتێکی ناتەواوی و کەم و کوڕی یەوە، هەروەها بەتەنها ناسینی خوای گەورە لەو ناوانەدا کە خۆی پێ ناو ناون وە لەو سیفەتانەدا کە لەقورئان و سوننەت دا خوای گەورە وەسفی خۆی پێکردوون.**

## هێنانەدی یەکخواپەرستی ناو سیفەتەکان

١- بەدوور گرتنی خوا لە هەموو لەکەو ناتەواوی و کەم و کورتیەك.

٢- باوەڕ بوون بەو ناو سیفەتانەی کە لەقورئان و سوننەت دا هاتوون بەشێوەی ڕاستەقینەیی خۆیان. بەبێ (شێواندن و ماناگۆڕکێ و لە کارخستن و چۆنایەتی و لێچواندن)بێت.

٣- نیاز بڕین لە پەی بردن بە چۆنیەتی و شێوەی سیفەتەکانی خوای گەورە نەبە دڵ و نەبەزمان و نەبە بۆچوون نابێت چۆنییەتییان دەستنیشان بکرێت.

هەرکەس ناوەکانی (أللە) بژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە بەڵام دەبێت ئەم مەرجانەی خوارەوە جێبەجێ بکات:

١- لەبەرکردنییان.

٢- تێگەشتن لەواتاکەیان.

٣- پاڕانەوە لەخوای گەورە پێیان.

٤- بە ئاگابوون لێیان.

## پێناسەی پەرستن(العبادة)

واتە: ناوێکی کۆکەرە وە یە بۆ هەموو ئەوشتانەی خوای گەورە خۆشی دەوێن پێیان ڕازیییە لە وتەو کردە وە نهێنی و ئاشکراکان.

مەرجەکانی وەرگرتنی پەرستنەکان لە لایەن خوای گەورەوە.

١- ئەوکەسەی کە ئەنجامی دەدات دەبێت باوەڕداربێت.

٢- مەبەستی لەکردنی کارەکە تەنها ڕەزامەندی خوای گەورە بێت.

٣- کارەکەی لەگەڵ پەیامی خوادا بگونجێت و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوا نەبێت ﷺ..

٤- ڕەچاوی پێشینەی تێدا بکات بزانێت کام کردەوە یان لەپێشترە کە ئەنجامی بدات.

## ماناى لاإله إلاالله

واته: هیچ پەرستراوێك نی یه به ڕاستی بپەرسترێت بێجگه له الله.

هەروه ها لاإله إلاالله لەسەر دووپایه ڕاوه ستاوه:

یه کەم: نکوڵی کردن لەوەی کەوا هیچ پەرستراوێك نی یه شایەنی پەرستن و بەندایەتی کردن بێت.

دووەم: چەسپاندنی ئەوەی کەوا هەر خوای گەوره خۆی بەتاك و تەنها شایەنی بەندایەتی کردن و پەرستنه.

### مەرجەکانی لاإله إلا الله

هەرکەسێك شایەتی بدات و بڵێ لاإله إلا الله دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت ئەوکات دەبێت به باوەڕداری ڕاستەقینه:

١- (العلم) زانینی واتاکەی.

٢- (اليقين) دڵنیایی.

٣- (القبول) ڕازی بوون.

٤- (الإنقياد) مل کەچ کردن و پابەندبوون.

٥- (الصدق) ڕاستگۆیی.

٦- (الإخلاص) نیاز پاکی.

٧- (المحبة) خۆش ویستنی.

٨-(كفر بالطاغوت) بێباوەڕبوون به تاغوتان.

## هێنانەدی یەکخواپەرستی ڕاستەقینە

یەکەم: نیازپاکی و دڵسۆزی بۆ خوای گەورە  لە پەرستندا.
ئەویش بەڕە چاوکردنی ئەم خاڵانە دەبێت:
١- خۆشەویستی ڕاستەقینە بۆ خوا.
٢- ترسانی ڕاستەقینە لەخوا.
٣- بەتەنها ناسینی خوا لەپاڕانەوەو پشت بەستن تکاکردن.
٤- ئەنجامدانی دروشمەکانی پەرستن بە نیاز پاکی بۆ خوا.
٥- پیادەکردن و چەسپاندنی بەرنامەو شەریعەتی خوا.

### دووەم : دەست بەردار بوون و خۆبەری کردن لە (طاغوت)

پێناسەی طاغوت: هەموو شتێکە کەبەندە لەسنوری خۆی بەدەر دایبنێت لە(پەرستراو) یان(شوێن هەڵگیراو)یان (گوێڕایەڵی کراو) طاغوتی هەرگەلێکیش ئەو کەسەیە کە بێجگە لەخواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.دە یکەن بەدادوەر،یان بێجگە لەخوا دەیپەرستن ،یان کوێرانە شوێنی دەکەون، یان لەشتێکدا گوێڕایەڵی دەکەن کەنازانن گوێڕایەڵی خوایەو دەبێتە پەرستن.

## سەرانی طاغوت

طاغوتان زۆرن بەڵام سەرانیان ئەم پێنجەن:

١- شەیطان(إبلیس).

٢- کەسێك بپەرسترێت و خۆشی بەوە ڕازی بێت.

٣- کەسێك بانگی خەڵکی بکات بۆ ئەوەی بیپەرستن.

٤- کەسێك لافی غەیب زانی لێبدات.

٥- کەسێك حوکم بە غەیری بەرنامەی خوا بکات.

## هاوبەش دانان (الشرك)

سەرەتای هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە لە گەلەکەی (نوح) علیه السلام دا سەری هەڵداکە شەیطان چرپاندی بە گوێیاندا لە جێی (وەدو سواع و یەغوث و یەعوق) کەلە پیاو چاکەکانییان بوون پاش وەفاتییان وێنەو بتییان دروست بکەن و بیان پەرستن.

وە لەناو مەککەشدا یەکەم کەسێك کە بتی هێنا عەمری کوڕی عامیری خوزاعی بوو تا ژمارەی بتەکان گەشتنە نزیکەی(٣٦٠)بت دواتر لە پاش ڕزگارکردنی مەککە هەموویان شکێنران و لەناو بران.

## هاوبەش بڕیاردان لە دوو ڕووەوە سەرچاوە دەگرێت

### یەکەم: لەبیرو باوەڕدا(الإعتقاد).

١- هاوبەش دانان لە کردارەکانی خوای گەورەدا.

٢- هاوبەش دانان لە سیفەتەکانی خوای گەورەدا.

### دووەم: لە شوێن کەوتندا(الإتباع).

١- هاوبەش دانان لە پەرستندا.

٢- هاوبەش دانان لەیاساو ڕێسا دانان دا.

### پێناسەی هاوبەش دانان:

مانای ئەوەیە کەوا بەندە شتێکی تر بکات بە هاوبەش و هاوتای خوا و جۆرێك یان چەند جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستنی بۆئەنجام بدات ئیتر با ئەو شتەی کەدەیکاتە هاوتاو هاوبەش پێغەمبەرێکی نێرراو بێت،یا فریشتەیەکی نزیکی خوا بێت، یان پیاو چاك و دۆست و وەلی یەکی خوا بێت، یان جنۆکە بێت،یان دارو بەرد بێت،یان ئاژەڵ،یان ئاگر بێت یان خۆر و مانگ و ئەستیرە بێت یان مرۆڤێك بێت یان یاسایەکی پێچەوانەی یاسای خوا بێت یان هەرشتێکی تر بێت. وە ئەو شتەی کە دەیکاتە هاوبەشی خوا خۆشی دەوێت و لێی دەترسێت،وە شوێنی دەکەوێت بەبێ ڕەزامەندی خوا، وە گوێڕایەڵیشی دەکات لە نافەرمانی یەکانی خوای گەورەدا ئەمانە و چەندینی تر بە هاوبەش دانان دەژمێردرێن.

## جۆرەکانی هاوبەش دانان

یەکەم : هاوبەش بڕیاردانی گەورە(الشرك الأكبر)

مانای ئەوەیە کەوا مرۆڤ لەئیسلام دەردەکات، وە پێچەوانەی یەکخواپەرستی خوای گەورەیە،وە خوای گەورە هەرگیز لەخاوەنەکەی خۆش نابێت.

### جۆرەکانی هاوبەش بڕیاردانی گەورە:

١- پاڕانەوە لەغەیری خوای گەورە:

٢- سەربڕین بۆ غەیری خوای گەورە.

٢- ترسان لەغەیری خوای گەورە.

٤- باوەڕبوون بەوەی کەوا خوا کوڕ یان کچ یاخود یاریدە دە ری هەیە.

٥- حەڵاڵ کردن یان حەرام کردنی شت بەپێی ئارەزوو.

### دووەم: هاوبەش بڕیاردانی بچوك(الشرك الأصغر)

بریتییە لەو تاوانە گەورانەی کە مەترسی یان لێدەکرێت خاوەنەکانییان بە بێ ئیمانی بمرێت ئەگەر خوای گەورە فریای نەکەوێت پێش مردنی تەوبە نەکات ئەمیش دەبێت بە دوو بەشەوە:

## یەکەم: هاوبەش دانانی ئاشکرای بچوك.

کە بریتین لە:

١- سوێند خواردن بەغەیری خوای گەورە.

٢- هەڵواسینی تەمیمە.

٣- لەدەستکردنی دەستەوانەو موفەڕك.

٤- نوشتە کردن.

## دووەم: هاوبەش دانانی شاراوەی بچوك.

بریتییە لە هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە لە نیازو مەبەستەکاندا، وەك ئەوەی مرۆڤ کارێك یان قسەیەك بکات بۆ ڕوپامایی(الریاء)یان بۆ ناوبانگ دەرکردن.

## جۆرەکانی ڕوپامایی(الریاء)

١- ڕوپامایی بەووتە.

٢- ڕوپامایی بە لاشە.

٣- ڕوپامایی بە کردەوە.

٤- ڕوپامایی بە پۆشاك.

٥-ڕوپامایی بە هۆی هاوەڵەوە.

## دۆستایەتی و دووژمنایەتی(الولاء والبراء)

دۆستایەتی و دووژمنایەتی گرنگترین بنچینەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن دەبێت مرۆڤی باوەڕدار دۆستایەتی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ و باوەڕداران بکات وە هەروەها پێویستە لەسەر کەسی باوەڕدار دووژمنایەتی و ڕق و کینەی بەردەوامی هەبێت بەرامبەر بە شەیطان و بێباوەڕان و دووڕوان و ئەو کەسانەی دوژمنایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن وە هەرشتێکی تریش کە لە چوارچێوەی ئەم دۆستایەتی و دووژمنایەتی یە بگرێتەوە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت ئەوا دەبێت خۆشەویستی و ڕق لێبونەوەکانمان تەنها لەبەر خوای گەورە بێت بەتەنهاو بەس.

### مافەکانی دۆستایەتی کردن لەبەر خوا

١- کۆچ کردن لەوڵاتی بێباوەڕانەوە بۆ وڵاتی مسوڵمانان.

٢- سەرخستن و یارمەتی دانی مسوڵمانان بە نەفس و ماڵ و زوبان.

٣- چیت بۆ خۆت پێ خۆشە دەبێت وابیت بۆ مسوڵمانانیش.

٤- دەبێت مافەکانی برایەتی جێ بە جێ بکەیت لەگەڵ یەکتریدا.

٥- سیخوڕی و جاسوسی نەکردن بەسەر مسوڵمانانەوە.

## داواکارییەکانی دووژمنایەتی لەبەر خوا:

١- ڕق و کینە بوون لە بێباوەڕان و هاوبەش دانەران.

٢- هەرگیز بێباوەڕان نەکەیتە پشتیوانی خۆت.

٣- پشت کردن لە وڵاتی بێباوەڕان و سەفەرنەکردن بۆی.

٤- لاسایی نەکردنەوەیان لەو شتانەی کە تایبەت مەندییانە.

٥- سەرنەخستنیان و بەباش باس نەکردنییان لەلای مسوڵمانان.

٦- بەشداری نەکردن لەجەژن و خۆشی یەکانیان دا.

٧- داوای لێبوردن نەکردن بۆیان لەخوای گەورە.

٨- چەورەیی نەکردن بۆیان لەسەر حیسابی ئاین.

٩- داوەریی نەکردن لە لایان.

١٠- دەست پێشخەری نەکردن لێیان بە سڵاوی ئیسلام کە (السلام علیکم)ە.

## پایەی دووەم: باوەڕهێنان بەفریشتەکان

فریشتەکان کۆمەڵە دروستکراوێکی خوای گەورەن نادیارن و خوای گەورە لەڕوناکی(نور) دروستی کردون و هیچ تایبەت مەندییەکی پەرستراویەتییان نییە، بەڵکو خۆیان بەندەن و خواپەرستی دەکەن و پابەندی تەواویان بەفەرمانەکانی خواوە هەیەو توانای جێبەجێ کردنیان پێدراوە و چاکەکارن، هەرگیز سەرپێچی ناکەن و لەدەریای خواپەرستیدا نقوم بوون.

### ناوی هەندێك لە فریشتەکان

فریشتەکانی خوا ژمارەیان زۆرە و دیاری نەکراوە لە قورئان و فەرمووده دا بەڵام ناو وکاری هەندێکیان مان بۆ باسکراوە کە ئەمانەن:

١- جوبرەئیل (علیه السلام) فریشتەی نیگا(وەحی).

٢- میکائیل(علیه السلام) فریشتەی باران بارین.

٣- ئیسرافیل(علیه السلام)فریشتەی فوکردنی کەڕەنا(نفخ الصور).

٤- مالیك(علیه السلام) فریشتەی خەزنەداری دۆزەخ.

٥- مەلەکول مەوت (علیه السلام) فریشتەی گیان کێشان.

وە ناوی فریشتەی هاروت و ماروت هاتووە و هەندێکییان پێیان دەوترێت فریشتەی هەڵگرانی عەرش وفریشتەی گیان کردنە پەری ئادەمیزاد و فریشتەی چاودێری کەری ئادەمیزاد(رەقیب و عەتید) و فریشتەی دەرگاوانی بەهەشت وفریشتەی لێپرسینەوەی ناوگۆڕ و فریشتەی نوسینەوەی کردە وەکانی مرۆڤ و هەشیانە تەنهاکاری تەسبیحاتی خوای گەورە دەکەن تا...کۆتایی.

**شێوەیان:**

١- گەورە و بەهێزن.

٢- بەژمارەی جیا جیا باڵیان هەیە.

٣- جوانن.

٤- پلەو پایەی جیا جیان هەیە.

**شێوازی ژیانیان:**

١- نێرو مێیان نی یە.

٢- ناخۆن و ناخۆنەوە.

٣- بێتاقەت و ماندو نابن.

٤- شوێن و جێگەیان ئاسمانە.

## سیفەتی ڕەوشت و ئاکاریان:

١- خاوەنی ڕێزو چاکەن.

٢- بەشەرمن.

## توانایان:

١- دەتوانن خۆیان بگۆڕن.

٢- زۆر خێران.

٣- زانیارییان هەیە.

٤- کاروباریان ڕێك و پێکە.

## ئەو کردەوانەی بەرامبەر بەخوا ی گەورە ئەنجامی دەدەن.

١- نوێژ دەکەن.

٢- یادی خوای گەورە دەکەن و پاك و بێگەردی بۆ دەردە بڕن.

## پەیوەندی فریشتەکان بە بێباوەڕانەوە:

١- بە فەرمانی خوای گەورە سزای دەدەن.

٢- نەفرینی لێدەکەن.(لەعنەت).

## پەیوەندی فریشتەکان بە مسوڵمانانەوە:

١- خۆشیان دەوێت.

٢- ڕێگەی ڕاستی پیشان دەدەن.

٣- داوای لێخۆش بونی بۆدەکەن.

٤- درودی بۆ دەنێرن(دوعای خێر).

٥- ئامادەی کۆڕی زیکرو زانستی دەبن.

٦- مژدەو مزگێنی خۆشی پێدە دەن.

٧- لەکاتی تەنگانەو جەنگدا دێن بەهانایانەوە و پشتیوانی لێدەکەن و سەری دەخەن.

٨- لەگەڵ تەرمەکەیدا ئامادە دەبن.

## ئەوکارانەی فریشتەکان بەکردنیان نەفرەت لە خاوەنەکەی دەکەن:

کۆمەڵێك کردەوە هەن کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات و بەهۆیەوە فریشتەکان نەفرەت لە بکەرەکەی دەکەن گرنگترینییان ئەوەیە کە ئافرەتێك نەچێت بەدەم مێردەکەیەوە و ئەوکەسەی ئاسنی تیژ لەبراکەی بەرزبکاتەوە و ئەوکەسەی جوێن بەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا بدات ﷺ و ئەو کەسەی ڕێگر بێت لەبەردەم جێ بەجێ کردنی شەرعی خوادا و ئەو کەسەی داڵدەی بیدعە چی یەك بدات تا....هتد.

## پایەی سێیەم
## باوەڕهێنان بەکتێبە ئاسمانییەکان

کتێبە ئاسمانییەکان مەبەست لەو کتێبانەیە کەخوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام)ناردون بۆ ئەوەی ببنە مایەی ڕێنمانیی و ڕۆشنایی بۆ خەڵکی و بەهۆیانەوە بەختەوەری و کامەرانی دنیاو دوارِۆژ بەدەست بێنن.

باوەڕهێنان بە کتێبەکانی خوای گەورە ئەم خاڵانە دەگرێتەوە:

یەکەم: باوە ڕت وابێت کەوا بەڕاستی لەلایەن خواوە نێردراون.

دووەم: کارپێ کردن و ڕازی بون و ملکەچ کردن.

سێیەم: بڕوابوون بەو هەواڵانەی پێمان ڕادەگەیەنن و بەڕاست زانینی.

چوارەم: باوەڕهێنان بەوەی قورئان دوایین کتێبە.

پێنجەم: باوەڕهێنان بەوکتێبانەی کەبەناوی خۆیان ناویان دەزانین.

هەروەها ئەوەش کەناویان نازانین،وە ئەوانەی کەناویان دەزانین ئەمانەن:

## ناوی کتێبە ئاسمانییەکان:

١- سوحوف(الصحف) بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم و موسا ڕەوانەکراوە بەڵام ئەوەی ئیبراهیم هەمووی پەند بووە ئەوەی موسا هەمووی ئامۆژگاری بووە(سەلامی خوایان لەسەربێت).

٢- تەورات(التوراة) بۆ پێغەمبەر موسا(علیه السلام) ڕەوانە کراوە

٣- زە بور(الزبور) بۆ پێغەمبەر داود(علیه السلام) ڕەوانە کراوە.

٤- ئینجیل(الإنجیل) بۆ پێغەمبەر عیسا(علیه السلام) ڕەوانەکراوە.

٥- قورئان(القرآن) بۆ پێغەمبەری ئیسلام محمد ﷺ ڕەوانە کراوە کە کۆتا پەیامی خواییە بۆ سەرزەوی، خوای گەورە خۆی دەیپارێزێت کەس ناتوانێت دەسکاری بکات و بیگۆڕێت وەك کتێبەکانی پێشو چونکە جیاوازی لە نێوان قورئان و کتێبەکانی پێشو ئەوەیە کتێبەکانی پێشو خوای گەورە دایبەزاند بۆ گەلەکانی پێشو وە داوای لێکردن کە خۆیان بیپارێزن بەڵام نەیان توانی و بە پێچەوانەشەوە گەلەکانی پێشو لە پاش پێغەمبەرەکانییان دەسکارییان کردو بەئارەزوی خۆیان شێواندنییان بەڵام قورئان خوای گەورە خۆی بەڵێنی داوە کە بیپارێزیت و کەسیش ناتوانێت دەسکاری بکات، قورئان پوختەی پەیامەکانی پێشوشی لە خۆ گرتووە و بۆ سەرجەم مرۆڤایەتییە تا ڕۆژی قیامەت لە پێش هاتنی قیامەت خوای گەورە قورئان بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و هیچ ووشەیەکی لەسەر زەوی نامێنیت نە لە دڵەکاندا نە لەسەر پەڕواەکانیش دا وە دەبێت ئەوەش باش بزانین کەوا قورئان ووتەی

خوای گەورەیە و یەکێکە لەسیفەتەکانی خوای گەورە نەك وەك دروستکراوەکانی تر کەوا خوای گەورە دروستی کردوون.

**ئەرکی سەرشانمان بەرامبەر بەقورئان:**

**١- پاراستنی و بە گەورە زانینی و ڕێزگرتنی قورئان.**

**٢- خوێندنەوەو لەبەر کردنی.**

**٣- فێرکردنی خەڵکی و خوێندنی.**

**٤- بیرکردنەوە لە واتاکەی.**

**٥- پەیڕە وی کردنی فەرمانەکانی.**

## پایەی چوارەم
## باوەڕهێنان بە پێغەمبەران

ئەوەیە کەوا بیرو باوەڕێکی تەواوی بێگومانمان هەبێت بەوەی خوای گەورە بۆ هەموو گەل و نەتەوەیەك پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردووە لە خۆیان، کەوا بانگی نەتەوەکەی خۆی بکات بۆ بەندایەتی کردن و پەرستنی خوای گەورە بەتاك و تەنها و دوور کەوتنەوە و بێباوەڕی کردن بە هەر هاوەڵ و هاوبەشێك کە خەڵکی بۆی بڕیار دەدەن، وە مژدە دەریش بن بە ڕەزامەندی خوایی بۆ ئەوانەی گوێڕایەڵیان دەبن، وە ترسێنەرو ئاگادار کەرەوەش بن بە تووڕە بوونی خوایی بۆ ئەوانەی بێگوێیان دەکەن.

نێرراو(رسول): ئەو کەسەیە کەخوای گەورە سروشی(وەحی)بۆدەکات و پەیام و شەریعەتی بۆ دەنێرێت و فەرمانی پێدەکات بەخەڵکی ڕابگەیەنێت.

پێغەمبەر(نبي): ئەوکەسەیە کەخوای گەورە سروشی(وەحی)بۆ دەکات، بەڵام فەرمانی پێناکات بەخەڵکی ڕابگەیەنێت ،بەڵکو لەسەر شەریعەتی پێغەمبەرەکەی پێشوی دەڕوات و لەناو خەڵکیدا پیادەی دەکات.

کەوا بوو دەوتوانین بڵێین هەموو نێرراوێك پێغەمبەرە، بەڵام هەموو پێغەمبەرێك نێرراو نیە بەڵام پێغەمبەری خوا محمد ﷺ نێرراو(رسول) و پێغەمبەر(نبي) شە.

ژمارەی پێغەمبەران زۆرن لەفەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ زۆرییان باس کراون و ژمارەی دیاری کراوییان نییە کەوا بۆ هەر گەلەو پێغەمبەرێکی ناردووە وە لە قورئاندا خوای گەورە بیست و پێنج یانی باس کردووە، کە ئەمانەی لای خوارەوەن:

(أدم، نوح، إدريس، هود، صالح، إبراهيم، إسماعيل، إسحاق، يعقوب، يوسف، لوط، شوعەيب، يونس، موسا، هارون، إلياس، زكريا، يحيى، اليسع، ذوالكفل، داود ، سليمان، أيوب، عيسى، محمد)

## پێغەمبەرە کۆشش کارو خاوەن تواناکان لەڕەوانەکراوان:

ئەو پێغەمبەرانەن کە زۆر هەوڵیان داوە و ئارامییان گرتووە لەبەرامبەر گەلەکانییان دا ژمارە یان پێنجە و کە ئەمانەن:

(نوح، إبراهيم، موسى، عيسى، محمد ﷺ)

دەبێت ئەوە بزانین کەوا پێغەمبەرانی پێشو(سولامی خوایان لەسەر بێت) هەریەکەو بۆ گەلێك هاتوون بەڵام پێغەمبەری ئیسلام محمد ﷺ پێغەمبەری سەرجەم مرۆڤایەتی یەو لە پاش ئەویش هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت واتە بە پێغەمبەری ئاخیر زەمانیش ناسراوە و دەبێت هەرچی ئاینەکانی تری وەك جولەکە(يهودي)و گاور(نصارى) ش شوێنی ئەم پێغەمبەرە بکەون چونکە لەپاش هاتنی محمد ﷺئاینی ئەوان سڕاونەتەوە لای خوا دەبێت هەموو خەڵکی لە پەری و ئادەمیزاد شوێنی بکەون.

## بەڵگەی راستێتی دوایین نێردراو پێغەمبەری خوا محمد ﷺ:

١- ڕاستگۆیی پێغەمبەر محمد ﷺ.

٢- خۆنەویستی پێغەمبەر محمد ﷺ.

٣- نەخوێندە واری پێغەمبەر محمد ﷺ.

## تایبەت مەندییەکانی پێغەمبەری ئیسلام محمد ﷺ

پێغەمبەری ئیسلام ﷺ شەش تایبەت مەندی بەسەر پێغەمبەرانی تردا هەیە ئەوانیش:

١- ووتەی کورت و پڕمانای پێدراوە.

٢- دووژمن لە دوری یەك مانگە ڕێوە لێی دەترسێت.

٣- دەسکەوتی جەنگ(غەنیمەت)ی بۆ حەڵاڵ کراوە.

٤- زەوی بۆ کراوە بە پاکژکەرە وە(الطهارة)و جێگەی نوێژ.

٥- بۆلای تێکڕای خەڵکی ڕەوانە کراوە.

٦- دوایین پێغەمبەرە ﷺ و پێغەمبەری تری بەدوادا نایەت.

## ئەرکی سەرشانمان لە بەرامبەر پێغەمبەری خوادا ﷺ:

١- خۆشویستنی خۆیی و ﷺ بنەماڵەو هاوەڵەکانی.

٢- شوێن کەوتن و گوێڕایەڵی کردنی.

٣- درودو سەڵاوات دان لەسەری.

## کاریگەری باوەڕ بوون بە پێغەمبەران:

١- زانینی ڕادەی گرنگیدانی خوای گەورە بە بەندەکانی.

٢- هەڵبژاردن و بەیادکردنی کەسایەتی بێ وێنە و بڵند.

٣- جیاکردنەوەی بەرەی چاکەکار و تاوانبار.

## پایەی پێنجەم
## باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی

ڕۆژی دوایی: ئەو ڕۆژەیە کە خەڵکی تێدا بۆ لێپرسینەوەو پاداشت وەرگرتن زیندوو دەکرێنەوە، دوا ڕۆژو سەرئەنجامەو هیچ ڕۆژێکی تری بەدوادا نایەت.

باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی: واتە باوەڕهێنان بەسەرجەم ئەو هەواڵانەی، کەخوای گەورە لەکتێبەکەیداو پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەرموودەکانیدا پێیان ڕاگەیاندووین،دەربارەی ئەوکارەسات و بەسەرهاتانەی لەپاش مردن وکۆتایی هاتنی ژیانی دونیا ڕو دەدەن.

باوەڕهێنان بەو کارەساتانەی کە لە پێش و سەرەتای ڕۆژی دواییین:

### یەکەم: نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی.

نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دەکرێت بەدوو بەشەوە:-

یەکەم: نیشانەبچووکەکانی قیامەت: زانایان ڕەحمەتی خوایان لێبێت نیشانە بچووکەکانیان کردووە بەدوو بەشەوەکە بریتین لە:

١- ئەو نیشانانەی کەپێشتر هاتونەتەدی و ڕوویان داوەو تێپەڕبوون، کەزانایان شوێنی ڕوداوەکانیان دیاری کردووە، وەك: (هاتنی پێغەمبەرﷺو لەت بونی مانگ و وەفاتی پێغەمبەرﷺ شەهید کردنی عومەری کوڕی خەطاب، شەهیدکردنی عوسمانی کوڕی عفان، جەنگی (جمل) لەنێوان لەشکری ئیمامی علی ولەشکری عائیشەی دایکی ئیمانداران، جەنگی (صفین) لەنێوان ئیمامی علی و معاوی یەدا، سەرهەڵدانی فیتنەی خەواریج وجەنگی(نهروان)،دابەزینی ئیمامی حسن لە خەلیفایەتی بۆ معاوییە، گەشتنی ئیسلام بەخۆر هەڵات و خۆرئاوا، گڕکانێك لەحیجاز ڕوودەدات،شەڕکردن لەگەل تورك دا،سەرهەڵدانی نزیکەی(٣٠)درۆزن کەلافی پێغەمبەرایەتی لێدەدەن، فیتنەی هەرەج و کوشتاری نێو خۆی مسوڵمانان،دروست بونی (٧٣) کۆمەڵ وشوێن پێ هەڵگرتنی گەلانی ڕابردوو،فیتنەکان لە خۆرهەڵاتەوە سەرهەڵ دەدەن).

**٢- ئەونیشانانەی کەبەنیشانەکانی ناوەڕاست یان نیشانەناوەندییەکان دەژمێردرێن، کەئەونیشانانەدەگرێتەوەکەهەتا ئەمڕۆ بەبەردەوامی لەبەر چاو بەرجەستەن ودەبینرێن، وەئەگەر نەشڵێین هەموویان ئەوا بەشی هەرەزۆریان هاتونەتەدی، وەك(نەمانی دەست پاکی و ئەمانەت،کەسانی بێ نرخ کاروباری مسوڵمانان دەگرنەدەست،کەم بوونی زانست و زۆربوونی نەزانین،زۆربوونی پۆلیس ودەست و پێوەندی ستەم کاران،پەیدابوونی ئافرەتی ڕوت وزۆربوونی زینا کردن، خواردنەوەی مەی بەئاشکراو بەحەڵاڵ زانینی، زۆربوونی ئامێری مۆسیقاو گۆرانی بێژان، زۆربوون و بڵاوبوونەوەی سووخۆری وکەم بوونەوەی پارەی حەڵاڵ،گرنگی دان بەڕازاندنەوەی مزگەوتەکان بە دیکۆر، زۆربوونی کوشت و کوشتار،بەرزکردنەوەی بیناو خانوبەرە، لێك نزیك بوونەوەی کات و لێك نزیك بونەوەی بازاڕەکان،وەچەندینی تر کەبەردەوام ڕودەدەن و بەچاوی سەر دەیان بینین....).**

**کۆتایی نیشانە بچوکەکانیش هاتنی مەهدی یە(علیە السلام) والله اعلم.**

## دووەم: نیشانە گەورەکانی قیامەت:

عبداللەی کوڕی عمر(خوای لێ ڕازیبێت) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ کەفەرموویەتی: نیشانەکان وەك مورووی هۆنراوەوان لەسەر پەتێك، هەر لەگەڵ پەتەکەبچڕا یەك بەدوای یەکدا دەخزێن ودەکەونەخوار. لێرەدا زانایان دەفەرموون کەنیشانەگەورەکانی قیامەت لەماوەیەکی کورت دا یەك بەدوای یەك دێن و وەکەدەستی پێکرد وەستانی نییە تا کەوتنەخوارەوەی دوامورو واتە تاهاتنی دوانیشانەکانی قیامەت،ئەونیشانانەش زۆرن وەك هاتنی دەجال، دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم، هاتنی یاجوج و ماجوج.......!

تا ئێرە دەتوانین بڵێین بەوتەرتیبە یەك بەدوای یەك دادێن!؟

بەڵام ئەونیشانانەی تر ناتوانرێت تەرتیبیان بۆ دابنێین چونکەتەرتیب نەکراون تەنیا خوای گەورە دەزانێت کەکامیان پێش کامیان دەکەوێت ئێمەش بەبێ بەڵگەلەسەری دەوەستین إن شاألله وەك:

هاتنی دووکەڵێکی گەورە(الدخان)، هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوە، داخستنی دەرگای تەوبە، دەرچوونی گیاندارێك(الدابة)، هەڵگیرانی قورئان و پوکانەوەی ئیسلامەتی، هەڵکردنی بایەك کەڕۆحی ئیمانداران دەکێشێت، ڕوخاندنی کەعبەی ماڵی خواوکاول بونی مەدینەی شاری پێغەمبەری خواﷺ ڕوودانی سێ ڕۆچوونی گەورە لەسەر زەوی، ئاگرێك خەڵکی ڕاپێچ دەکات و کۆیان دەکاتەوە.

## دووەم: تێك چونی ژیان و بونەوەر.

گەورەترین و سامناکترین کارەسات کەلەسەرەتای هاتنی ڕۆژیی دوایی ڕوودە دات تێکچونی ژیان و بوونەوە رە دەسپێکی ئەم تێکچونەش ئەوەیە بە فەرمانی خوافریشتە(ئیسرافیل)فوی یەکەم دەکات بەکەڕە نادا(نفخي صور) ڕێسای هەموو بونەوەر تێك دەچێت و بەم شێوەیە دەگۆڕێت:

١- ئاسمان شەق دەبات و خۆر دەکوژێتەوە و ئەستێرەکان هەڵ دەوەرن و زەوی و شاخەکان گرمەو ناڵە دەکەن و دەریاکان دەتەقنەوە.

٢- هەموو بوونەوەر گۆڕانی بەسەردا دێت و بە پێچراوە یی دەکەوێتە دەستی خوای گەورە وە.

٣- هەرچی گیانلەبەرە بەزیندە وە رو مرۆڤ و ئاژە ڵ و جنۆکەو فریشتەوە هەموویان دەمرن و کەس نامێنیت بێ لەوەی خوا ویستی لەسەر بێت کە دەیهێڵێتەوە.

## باوەڕهێنان بەو بەسەرهاتانەی لە پاش مردن ڕوودەدەن

### یەکەم: گیان کێشان: چۆنییەتی گیان کێشانی باوەڕدار:

پێغەمبەری خواﷺ دە ربارەی گیان کێشانی باوەڕدار دەفەرمووێت: ئەگەر بەندەی باوەڕدار لەدنیا دابڕاو بەرەوقیامەت وەرچەرخا، لە ئاسمانەوە فریشتە دێتە خوارەوە بۆلای، ڕوویان سپییە، دەم و چاویان دەڵیی خۆرە،کفنیان پێ یەلەکفنی بەهەشت، مۆمیاو بۆنیان پێ یەلەبۆنی بەهەشت،دێن و بەدەوریدا بەئەندازەی دوورایی بینینی چاودادە نیشن(واتە هێندەزۆرن)ئینجا فریشتەی گیان کێشان (ملك الموت) عليه‌السلام، دێت و لەلای سەری یەوەدادە نیشێت و دەڵێ: ئەی نەفسی پاك وەرەدەرەوە بۆ لێخۆش بوون وڕەزامەندی خوا،پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: وەك چۆن دڵۆپەئاو لەدەمی گۆزەوە دەتکێت ئاوائەوگیانەدەردەچێت،ئینجا دەیکێشێت و بەئەندازەی چاو تروکاندنێك لەدەستی دا نایهێڵێتەوە بەڵکو هەڵی دەگرن و دەیخەنەکفن و بۆنەکەوەئەوەیەکەخوای گەورەدەفەرمووێت: (إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ)(الأنعام/٦١) واتە: ئەوکاتەی کە مەرگ ئێخەبەیەکێکیتان دەگرێت نێرراوەکانمان دەیمرێنن و فەرامۆشی ناکەن. ئەوگیانەبۆنێکی لێ دێت وەك خۆشترین بۆنی سەرزەوی وایە. (رواه احمد وابو داود،وهو صحيح على شرط الشيخين).

## چۆنییەتی گیان کێشانی بێ باوەڕ:

پێغەمبەری خواﷺ دە ربارەی گیان کێشانی بێ باوە ڕ دەفەرمووێت: ئەگەر بەندەی بێ باوەڕ لەدنیا دابراو بەرەو قیامەت گەڕایەوە، لە ئاسمانەوە فریشتەی بۆ دادەبارن ،ڕقن وبەهێزن دەم وچاویان ڕەشە، کفنی زبری موویی یان پێ یە،بەئەندازەی دوورایی بینینی چاو بەدەوریدا دادەنیشن ئینجا فریشتەی مەرگ(ملك الموت)دێت لەلای سەری یەوە دادەنیشێت و دەڵێ :ئەی نەفسە پیسەکەوە رە دەرەوە بۆ ڕق و توو ڕەیی خوا، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرمووێت: گیانەکە بەلاشەیدا بڵاو دەبێتەوە، ئەویش بەدەرکێشان دەری دەکێشێت وەك چۆن دڕك لەخوری تەڕ دەردەکێشرێت وڕەگ ودەمارەکانی پێوەی دەپچڕێن، ئینجا هەمو فریشتەکانی ئاسمان نەفرینی لێ دەکەن و دەرگاکانی ئاسمان دادەخرێن،دەرگاوانەکانی هەردەرگایەك لەخوا دەپاڕێنەوەبۆ ئەوەی گیانەکەی بەلایاندا بەرز نەکرێتەوە،ئنجا فریشتەی مەرگ دەیکێشێت و بەئەندازەی چاوتروکاندنێك لەدەستی دا نایهێڵێتەوە بەڵکو دەیخەنە ئەو کفنە زبرەوەو بۆنی بۆگەنترین کەلاکی سەرزەوی لێ دێت.

## دووەم: تاقیکردنەوەی ناو گۆڕ:

پاش ناشتنی مردوو دووفریشتە دێنە لای کەزۆر بەسامن مردووەکە دادە نیشێنن و پرسیاری لێدەکەن پەروەردگارت کێ یە؟ئاینت چی یە؟ ئەو پیاوە کێ بوو لەناوتاندا ڕەوانە کرابوو؟کردەوەت چی بوو؟

ئەگەر کەسەکە مسوڵمان بێت ئەوا دەڵێت: پەروەردگارم الله یە و ئاینم ئیسلامەو پێغەمبەرەکەشم (محمد)ە ﷺ کردەوەشم کتێبەکەی خوا بوو ئینجا بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات کەوا ئەوا بەندەکەم ڕاستی کرد، بەڵام ئەگەر مردووەکە کەسێکی بێباوەڕ بێت ئەوا بۆ هەموو پرسیارەکان هەردەڵێت ها ها نازانم بەو شیوەیە وەڵام دەداتەوە تا بانگ دەرێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکات ئەوا بەندەکەم درۆی کرد.

## سێیەم: مەینەتی و شادی ناو گۆڕ:

ئەگەر کەسێك باوەڕدار بێت ئەوا لەناو قەبر کە پێی دەوترێت ژیانی بەرزەخ قەبرەکەی بۆ فراوان دەبێت و بۆی دەبێت بە باخێك لە باخەکانی بەهەشت و دەرگایەکیشی لەبەهەشت بۆ دەکرێتەوە تا ڕۆژی قیامەت لە خۆشیدا دەبێت،بەڵام ئەگەر کەسێك بێباوەڕ بێت ئەوا قەبرەکەی لێ تەسك دەکرێتەوەو بۆی دەبێت بە چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ وە دەرگایەکی لە دۆزەخەوە بۆ دەکرێتەوە تا ڕۆژی قیامەت سزا دەدرێت.

## باوەڕهێنان بە زیندوو بوونەوە

لە پاشان دا هەرکات خوای گەورە ویستی لەسەر بوو ئەمر دەکات بە (ئیسرافیل) فوی دووەم بکات و سەر لە نوێ هەموو بوونەوەر زیندوو دەبنەوە بە فەرمانی خوا بۆ دادگایی کردن بەرێ دەکرێن لەپاش لێپرسینەوە ئەوەی بێباوەڕ بێت نامەی کردەوەکانی بەدەست چەپ وەردەگرێت و لەپردی صیراط ناتوانێت بپەڕێتەوە دەکەوێتە ناو ئاگری دۆزەخ و ئەو کەسەی باوەڕدار بێت نامەی کردەوەکانی بە دەستی ڕاست وەردەگرێت و بەسەر پردی صیراط دا دەپەڕێتەوە و دەچێتە سەر حەوزی کەوسەر بەدەستی پێغەمبەری خوا ﷺ پەرداخێك ئاودەخواتەوە لە پاش شکاندنی تینوێتی بەو پەڕی ڕێزە وە بەرەو بەهەشت بەرێ دەکرێت.

### کاریگەری باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی لەسەر ژیانی مسوڵمان:

١- سەرئەنجام و چارەنوسی بۆ دیاری دەکات.

٢- بەتێڕوانینێکی واقیعییانە ژیانی دونیا دەنرخێنیت و لەسنوری پێویست زیاتر گرنگی پێنادات.

٣- هەوڵی کردەوەی چاك دەدات و کاتی خۆی لەشتی بێ کەڵکدا بەفیڕۆ نادات.

٤- خۆی لەکردەوەی ناپەسەندو ڕەفتاری بەدو خراپ بەدوور دەگرێت و پارێزییان لێدەکات.

## باوەڕهێنان بە بەهەشت و دۆزەخ

بەهەشت و دۆزەخ دوو دروستکراوی خوای گەورەن کە بەڵێنی داوە لە قورئان دا لەپاش مردن و زیندوو بوونەوە ئەوەی کە باوەڕدار بێت بیخاتە ناو باخەکانی بەهەشت و ئەوەی کە بێباوەڕو سەرکەش و یاخی بێت بیخاتە ناو ئاگری دۆزەخ.

بەهەشت: شوێنی باوەڕدارە خۆ پارێزەرە یەك خواپەرستەکانە و خانەی بەختەوەریی و خۆشی هەمیشەیی و بەهرەمەندییە و سەرچاوەی حەوانەوەی ڕاستەقینەیەو ڕەحمەتی نەبڕاوەی خوای گەورەیە.

دۆزەخ: شوێنی هەمیشەیی بێباوەڕانە، لە هاوبەش بڕیار دەرو جولەکەو خاچ پەرست و دووڕووەکان هەروە ها شوێنی کاتی باوەڕدارە تاوانبارەکانیشە، کەکردەوە خراپەکانییان لە چاکەکانییان زیاترە و خوای گەورەش لێیان نابورێت تا سزایان نەدات وە دۆزەخ خانەی مەینەت و خاکەسارییە و کانگای مەینەت و مەرگەساتە و سەرچاوەی ژان و ئازاری ڕاستەقینەیە.

## پایەی شەشەم

## باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر خێرو شەڕی

ئەوەیە کەوا بیرو باوەڕێکی بێگومانمان هەبێت بەوەی کە هەموو خێرو چاکەیەك ،وە هەموو شەڕو خراپەیەك بەبڕیارو دیاری کردنی خوای گەورە ڕوودەدات.

زانایانی ئیسلام بۆچوونی جیاوازیان لە پێناسەی قەزاو قەدەر هەیە، هەیانە بۆ هەردووکیان یەك پێناسە دەکات و بە یەك شت دایان دەنێت، هەشیانە قەزا بە شێوەیەك پێناسە دەکات،کە جیاوازە لە پێناسەی قەدەر، ئەوانەی کە بەشێوەیەکی جیاواز پێناسەی قەدەر و قەزا دەکەن ئاوا دەفەرموون:

قەدەر: زانیاری و ئاگایی خوای گەورەیە بەوە کە لەداهاتوودا دروست کراوەکان لەسەرین و ئەنجامی دەدەن.

قەزا: بەدیهێنانی هەموو شتەکانە لە لایەن خودی(الله) وە بەتەنها بەویستی ئەو.

ئەوانەی کە یەك پێناسەی قەدەر و قەزا دەکەن دەفەرموون:

ئەو نیزامە دامەزراوەیە کە خودی(الله) دایناوە بۆ ئەم بوونە، وە ئەو یاسا گشتی و سوننەتانەیە، کە بە هۆیەوە هۆکانی بەستووە بە هۆکارەکانەوە.

## باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر ئەم خاڵانە دەگرێتەوە:

١- باوەڕهێنان بەوەی کەخوای گەورە زانیاری دەربارەی هەموو شتێك هەبووەو هەیە.
٢- باوەڕهێنان بەوەی کە خوای گەورە سەرجەم زانیاری یەکانی دەربارەی بونەوەرو ژیان لە(لوح المحفوظ)دا تۆمارکردووە.
٣- باوەڕهێنان بەوەی هەرشتێك لەبونەوەردا ڕوبدات بەویستی خوای گەورە ڕو دەدات.
٤- باوەڕهێنان بەوەی کە هەرچی لە بونەوەردا هەیە بە خۆیی و سیفەت و جوڵەیەوە دروستکراوی خوای گەورەیە.
٥- باوەڕهێنان بەوەی هەرچی لە بونەوەردا ڕودەدات سەبارەت بەخوای گەورە چاکەو خێرە و بەپێی کاربەجێی و دادگەریی خۆی ئەنجامی دەدات.

## باوەڕهێنانمان بە قەدەر پێویستی بەم چوار خاڵە هەیە:

١- زانین: باوەڕ بونێکە بەزانیاری ئەزەلی زاتی(الله) لەزانینی کرداری بەندەکانی پێش ئەوەی ئەنجامی بدەن.

٢- نوسین: تۆمارکردنی ئەوکارانە لەتەختی پارێزراودا، چونکە بەزانیاری ئەزەلی خودی(الله)دا تێپەڕیان کردووە.

٣- ویست: ویستی خودی(الله)جێبەجێ کراوە وە دەسەڵاتیشی هەمە لایەنە.

٤- بەدیهێنان: خودی(الله) هەموو دروستکراوەکانی بەدیهێناوە لەگەڵ کردارەکانیان وەشێوەیان و بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

### کاریگەری باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر:

١- پشت بەستن بەخوای گەورە نەك بە هۆکارەکان.

٢- سوپاس کردنی خوای گەورە لەکاتی بەدەست هێنانی خواست و ئامانجەکاندا و خۆ بەدوور گرتن لەبەخۆنازین و لە خۆبایی بوون.

٣- ئارامی و دڵنیا بوون لەوکاتەدا کەقەدەری خوای گەورە بەڕێ دەبێت، هەروە ها دڵگران نەبون و بێ هیوا نەبوون بە لەدەست دانی خۆشەویستێك، یاخود دوچار بوون بە شتێکی ناخۆشەوە.

# بەشی دووەم
# (پایەکانی ئیسلام)
## پێناسەی ئیسلام

(الإسْلام): لەزمانی عەرەبدا ملکەچی وخۆبەدەستەوەدان دەگەیەنێت، واتە تەسلیم بوون بەبەرنامەی ألله سبحانه وتعالی.

خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ) (آل عمران: ١٩)

واتە: بێگومان ئاینی وەرگیراو لای خوای گەورە تەنها ئیسلامە ..

وە لەئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: (وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ) (آل عمران: ٨٥)

واتە: هەرکەسێك بێجگە لە ئیسلام پەیڕەوی ئاینێکی تر بکات ئەوە هەرگیز لێی وەرناگیرێت، ولە دوارۆژیشدا لە دۆڕاو وزەرەرمەندانە .

## پێناسەی ئیحسان

(الإِحْــســَـان): لەزمانی عەرەبدا جوان کردنەوە ورێکوپێك کردنە .
بەڵام لە شەرعدا ئەو واتایەی هەیە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لە فەرمودەکەی جبریلدا رونی دەکاتەوە، کە دەفەرمویێت: (أَنْ تَـعْبُـدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ) [رَوَاهُ مُسْلِم (١/رَقَم/٨)] فەرموودەکەی جبریل کە لە پرسیارەکەی دواتردا دەیهێنینەوە واتە: ئەوەیە کەوا بە شێوەیەکی وا بەندایەتی وپەرستن بۆ خوای گەورە بکەیت وەکو ئەوەی دەیبینی ، جا خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ، ئەوا ئەو هەر تۆ دەبینێت.
بە کورتی (الإِحْــسَـان) جوانکردنەوەی ناوەوە ودەرەوەی باوەڕدارە .

## جیاوازی لەنێوانی ئیمان و ئیسلام چییە؟

هەموو پایەکانی ئیمان نادیارو شاراوەن ، بەڵام پایەکانی ئیسلام دیارو ئاشکران.
هەربۆیە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر جەنازەیەك کرد ، جا دوعای خێری بۆ کرد وفەرموی: (اللَّــهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِــهِ عَلَى الإِسْـــلاَمِ وَمَـنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَـتَوَفَّهُ عَلَى الإِيْمَانِ)[رَوَاهُ أَبُودَاوُد(٣/رَقَم/٣٢٠١) وَالتـِّرْمِذِي (٣/رَقَم/١٠٢٤)] واتە: ئەی خوای گەورە ئەوەمان کەدەی ژیەنیت ئەوە لەسەر

ئیسلام بیژێنە، وەئەوەشیان کەدەیمرێنی ئەوە لەسەر باوەڕ وئیمان بیمرێنە.

دیارە لێرەدا ئیسلام بریتیە لە کردارە ئاشکراکان ، کە لە کاتی ژیاندا دەتوانرێت ئەنجام بدرێت، بەڵام ئەگەر موسوڵمان مرد ئەوە تەنها کردەوەکانی دڵی دەمێنێ، بۆیە فەرمووی لەسەر ئیمان وباوەڕ بیمرێنە .

بەم شێوەیە خوای گەورە ئەوکەسانەی کەوا دووڕوو مونافیقن جیا دەکاتەوە لە باوەڕداران لەڕۆژی دوایی دا، چونکە ئەوانیش دەتوانن لەژیانی دونیادا کردەوەبکەن بەپایەکانی ئیسلام و شایەتومانیش دەهێنن و نوێژو ڕۆژووش دەکەن و زەکات و حەجیش ئەنجام دەدەن و خۆیان وەك مسوڵمان پیشان دەدەن، بەڵام لەناخی دڵیانەوە باوەڕیان نیەو بێباوەڕن و هەمیشە لەگومان و دوو دڵیدا دەژین سەبارەت بەباسە نادیارو شاراوەکانی وەك باسەکانی ناو قەبرو ڕۆژی زیندووبونەوەو حەشرو حیساب و بەهەشت و دۆزەخ ، بەڵام لەڕۆژی دوایی دا خوای گەورە ڕووی ڕاستەقینەیان هەڵدەماڵێت و دەخرێنە ژێرەوەی ئاگری دۆزەخ.

## پایەکانی ئیسلام

یەکەم: شایەتومان.

دووەم: نوێژ.

سێیەم: ڕۆژوو.

چوارەم: زەکات.

پێنجەم: حەج.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لە خۆی وباوکی رازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ الإِسْلاَمَ بُنِيَ عَلَى خَمْس: شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيْتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصِيامِ رَمَضَانَ، وَحَجِّ البَيْتِ)

[رَوَاهُ البُخَارِي(١/رَقَم/٨) وَمُسْلِم(١/رَقَم/١٦) وَاللَّفْظُ لَهُ]

واتە: بەڕاستی ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە: شایەتی دان بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە بەڕاستی شایەن پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە، وهەستان بە کردنی نوێژەکان، وزەکات دانی ماڵ وسامان، و ڕۆژوگرتنی مانگی رەمەزان ، وحەج کردنی ماڵی خوا .

## پایەی یەکەم
## (الشهادتین) شایەتومان

هەرکەسێك بێتە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوەو بیەوێت ببێت بەکەسێکی مسوڵمان، ئەوە سەرەتا دەبێت شایەتومان بهێنێت و پاشان خۆی بشوات و غوسڵی بێباوەڕی دەردەکات و بەوشێوەیە دێتە ناو بازنەی ئیسلامەوەو دەبێت بەکەسێکی مسوڵمان.

شایەتومانیش بەم شێوەیە دەوترێت و دەڵێت: (أَشْهَدُ أَنّ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا الله وأَشْهَدُ ان محمداً رسول الله) واتە: شایەتی ئەدەم کەهیچ پەرستراوایێك نی یە کەبەڕاستی ببەپرسترێت بێجگە لە(ألله)، وە شایەتیش ئەدەم کە(محمد)یش ﷺ بەندەو نێردراوی (ألله)یە.

## هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام

هەروەك چۆن بەوتنی شایەتومان مرۆڤ دێتە ناو بازنەی ئیسلام و دەبێت بەکەسێکی مسوڵمان، بەهەمان شێوەش بەئەنجامدانی هەندێك کاروکردەوە لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەرەوەو بێباوەڕ دەبێتەوەو ئیسلام و شایەتومانەکەی هەڵدەوەشێتەوە،بۆیە دەبێت مرۆڤی مسوڵمان شارەزابێیت لێیان و خۆی بپارێزێت لەوشتانەی کەلەبازنەی ئیسلام ئەیکەنە دەرەوە، کەزانایانی ئیسلام(ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لەدەخاڵ دا باسیان لێوەکردووە.

١. هاوبەش دانان بۆ(ألله) لەپەرستن دا.
٢. دانانی نێوەندگیری و(وەسیلە) بۆ داواکردن لە خوای گەورە.
٣. بەبێباوەڕ نەزانینی بێباوەڕو هاوبەش بڕیاردەران.
٤. بەڕاست زانینی ئاینێکی تری غەیری ئاینی پیرۆزی ئیسلام.
٥. ڕق لێبونەوە لەسوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.
٦. گاڵتەکردن بەخوای گەورەو پێغەمبەرەکانی.
٧. باوەڕبوون بە جادووگەرو فاڵچی و ساحیرەکان.
٨. پشتیوانی کردن و یارمەتی دانی بێباوەڕان لەدژی مسوڵمانان.
٩. کەسێك واگومان بیات لەشەرعی خوا بچێتە دەرەوە ئاسایی یە.
١٠. پشتگوێخستنی دینی خواو هەوڵ نەدان بۆ فێربوونی.

# پایەی دووەم
# (الصلاة) نوێژ

(الصلاة) لە زمانی عەرەبدا بە واتای نزا وپاڕانەوە(الدُّعَاء) دێت .
وە لە زاراوەی شەرعیشدا مەبەست پێی ئەو راوەستان وقورئان خوێندن ورکوع وسجود وزیکرانەیە کە لە نوێژدا ئەنجام دەدرێت، وەکو لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە .

## گرنگی نوێژ چییە لە ئیسلامدا

نوێژ دووەم پایەیە لە پایەکانی ئیـــسلام لە گرنگیدا پاش شایەتومان و یەکخواپەرستی دێت .
بـۆیە دەبینین یـەکەم فەرزێك پاش شایەتومان کاتێك فەرز دەکرێت نوێژە، کە لە شەوی ئیسرا ومیعراجدا خوای گەورە پێغەمبەری خوای ﷺ، بەرز کردەوە بۆلای خۆی ولەسەری فەرز کرد ، جا ئەمەش خۆی لە خۆیدا گەورەترین بەڵگەیە لەسەر گرنگی ئەم پایەیە ، چونکە هەموو فەرزەکانی تری ئیسلام بە رێگای وەحی ولە زەویدا فەڕز کراوە ، تەنها نوێژ نەبێت کەڕاستەوخۆ خوای گەورە خۆی بە پێغەمبەری راگەیاند ، پاش ئەوەی بەرزی کردەوە بۆ سەرەوەی حەوت چینی ئاسمانەکان و وە نوێژ بەکۆڵەکەی ئیسلام باسی لێوە کراوە.

وە نوێژ لەگەڵ یەکخواپەرستی وزەکاتدا خوای گەورەو پاشان پێغەمبەری خواﷺ لە زۆر شوێنی قورئان وسوننەتدا پێکەوە باسیانکردووە وپێشی فەرزەکانی تریان خستـــوە.

وە نوێژ یەکەم فەرزێکە پاش یەکخواپەرستی کە لێپرسینەوە لەبەندە دەکرێت لەسەری لەڕۆژی دوواییدا.

وە نوێژ زۆربەی پەرستنەکانی دڵ وگوفتار وکردار لەخۆ دەگرێت.

پەرستنەکانی دڵ، وەکو: بیروباوەڕی دڵ (إعْتِقَادُ القَلْب) و ملکەچی (الخُضوع) و نیەت پاکی(الإخْلاص) و خۆشەویستی (المَحَبَّه) ودڵ ترسان (الخُشُوع) و هەستکردن بەچاودێری کردن خوای گەورە (المُرَاقَبَه) .. هتد

پەرستنەکانی زمان، وەکو: وتنی شایەتمان وقورئان خوێندن و زیکرکردن (سُبْحَانَ الله، الحَمْدُ لله، اللهُ أكْبَر ، ..) و بە گەورە وپیرۆز راگرتنی خوا وپاڕانەوە لە خوا وپەناگرتن بە خوا و داوای لێبوردن کردن لە خوا.. هتد.

پەرستنەکانی ئەندامەکانی تری لاشە ، وەکو: رکوع بردن وسجود بردن و ڕاوەستان وهەڵسانەوە.. هتد.

## پێنج فەڕز نوێژمان هەیە لەشەو ڕۆژێکدا

خوای گەورە لەئاسمان دا لەو شەوەی شەو ڕەوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، نوێژی فەڕز کردووە لەسەر مسوڵمانان کە پێنج نوێژە بەڵام پاداشتەکەی هێندەی پەنجا نوێژە بەم شێوەیە:

نوێژی بەیانی: دوو ڕکات

نوێژی نیوەڕۆ: چوار ڕکات

نوێژی عەسر: چوار ڕکات

نوێژی ئێوارە: سێ ڕکات

نوێژی خەوتنان: چوار ڕکات

کۆی گشتی ڕکاتەکانی دەکات حەڤدە ڕکات و دەبێت مرۆڤی باوەڕدار پابەندبێت پێیانەوەو وازیان لێ نەهێنێت، چونکە نەکردنی نوێژ هەڕەشەی سەختی لەسەرە لەلایەن خوای گەورەوە

سەبارەت بەچۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژ کردن دەکرێت لەلایەن دایکان و باوکان و مامۆستایانی فێرخوازەوە منداڵەکانیان فێر بکەن و و لێرەدا من ئاماژەم پێی نەداوە لەبەر ئەوەی پەڕتوکەکە تایبەتە بە بیروباوەڕەوە.

## پاداشتی نوێژ خوێنان لای خوای گەورە

سەبارەت بەپاداشتی نوێژخوێنان، خوای گەورە دەفەرموویێت: وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ () أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ () الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) [المؤمنون: ٩ – ١١] واتە: وە ئەوانەی کە پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن وبەڕێکوپێکی ئەنجامی دەدەن. بەڕاستی ئەوانە میراتگرانن. ئەوانەی کە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردەوس، کە بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە .

## حوکم و سزای نوێژ نەخوێن لای خوای گەورە

خوای گەورە دەفەرموویێت: (فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ () الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ () الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ () وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ) [الماعون: ٤ – ٧]

واتە: جا هاوار و واوەیلا بۆ نوێژخوێنان . ئەوانەی کە گوێ بە نوێژەکانیان نادەن و دڵیان لێی بێئاگایە. ئەوانەی کە ڕووپامایی دەکەن و بۆ خۆ دەرخستن دەیکەن. وهەمیشە هەوڵ دەدەن قەدەغەی چاکە کاری بکەن .

هەروەها لەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموویێت: (فَخَلَفَ من بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ()إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْئًا)[مريم: ٥٩ – ٦٠]

واتە: لە پاش پێغەمبەران وپیاوچاکان کۆمەڵانێک بونە جێنشین، نوێژەکانیان فەوتان وشوێنی ئارەزووەکانیان کەوتن، جا ئەوانە توشی گومڕایی وسزای دۆزەخ دەبن.

جگە لەوانەی کە پەشیمان دەبنەوە وباوەڕی دامەزراو دەهێنن وکار وکردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت.

هاوەڵی بەڕێز جابیر(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالكُفْـــرِ تَرْكُ الصَّلاَةِ) [رَوَاهُ مُسْلِم(١/رَقَم/٨٢)

واتە: بێگومان لە نێوان هەرکەسێک ولە نێوان هاوبەش بڕیاردان وبێباوەڕبوندا تەنها وازهێنانە لە نوێژ ، جا هەرکەسێک واز لە نوێژکردن بێنێ ئەوە بێباوەڕ دەبێت .

لە فەرموودەیەکی تریش کەهاوەڵی بەڕێز بورەیدە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (العَهْــدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاَةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَــفَرَ) [رَوَاهُ التِّرْمِذِي(٥/رَقَم/٢٦٢١ مَعَ التُّحْفَة) وَالنَّسَــائِي(١/رَقَم/٢٣١،٢٣٢) وَابْنُ مَاجَة(١/رَقَم/١٠٧٩)

واتە: ئەو پەیمانەی کە لە نێوان ئێمە وئەواندایە تەنها نوێژکردنە ، جا هەرکەسێک وازی لێ بێنێت ئەوە بێباوەڕ بووە .

## پایەی سێیەم: (صِيَامُ رَمَضَان) ڕۆژووی ڕەمەزان

پێناسەی ڕۆژوو (ألصوم) لە زمانی عەرەبدا بە واتای خۆگرتنەوە دێت . لە زاراوەی شەرعیشدا خۆگرتنەوەیە لە خواردن وخواردنەوە ونزیك بونەوە لەگەڵ خێزاندا هەر لە دەرکەوتنی گزنگەوە تا خۆرئاوا بوون ، بەو شێوەیەی لە کتێبەکانی شەریعەتدا باسکراوە .

سەبارەت بەفەڕزبوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش لە ساڵی دووی کۆچی رۆژوی رەمەزان فەڕز کرا لەسەر مسوڵمانان بە دەقی ئایەتی قورئان ، کە خوای گەورە دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ () أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ ۚ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ () شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ () [البقرة: ١٨٣ – ١٨٥]

واتە: ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە رۆژووتان لەسەر فەڕز کراوە هەروەکو لەسەر نەتەوەکانی پێش ئێوەش فەرز کرابو، بۆ ئەوەی خواناسی وپارێزگاری بکەن . چەند رۆژێکی ژمێرراوی دیاری کراو، خۆ ئەگەر کەسێک لە ئێوە نەخۆش بو یان لە سەفەردا بو، ئەوە با بەئەندازەی ئەو رۆژانەی بۆی نەگیرابو لە رۆژانی تر بگرێتەوە،

وە ئەوانەش کە بەزەحمەت دەتوانن رۆژو بگرن ، ئەوە با لەباتی هەر رۆژێك ژەمێك خواردن ببەخشن بە هەژارێك ، جا ئەوەی زیاتر ببەخشێت ئەوە باشترە بۆی، وە ئەگەر بەرۆژو بن ئەوە چاکترە وپاداشتیشی زۆرترە ئەگەر بزانن.

مانگی رەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە رێپیشاندەرێك بێت بۆ خەڵکی ، وجیاکەرەوەی هەقیشە لە ناهەق، جا هەرکەسێکتان ئەو مانگەتان بینی ئەوە بەرۆژو بن تیایدا .

## جۆرەکانی ڕۆژوو

ڕۆژووگرتن چەند جۆرێکی هەیە کەبریتین لە: ڕۆژووی فەڕز و ڕۆژووی سوننەت و ڕۆژووی کەفارەت و ڕۆژووی نەزر، هەریەکەیان تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو بەپێی بەڵگەی قورئان و سوننەت ئەنجام دەدرێت.

## حوکمی ڕۆژوو نەگرتن لە لەشەریعەتی ئیسلام دا

ئەو کەسەی باوەڕی بە رۆژوی رەمەزان نەبێت ئەوە بێباوەڕە ولە ئیسلام دەرچوە ، بەڵام ئەوەی باوەڕی پێ هەبێت ونەیگرێت ئەوە زۆر تاوانبارە ..

زانایانی ئیسلام یەکڕان کەوا هەرکەسێک باوەڕی بە فەرز بونی رۆژو نەبێت ئەوە بێباوەڕ دەبێت ولە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە .

هەندێک لە زانایان فەرمویانە: ئەگەر کەسێک بەبێ عوزری شەرعی رۆژو نەگرێت ، ئەوە بێباوەڕ دەبێت ولە بازنەی ئیسلام دەردەچێت ، ئیتر باوەڕی بە فەرز بونی هەبێت یان نە.

بۆنی دەمی ڕۆژووەوان خۆشترین بۆنە لای خوای گەورەو هەموو کردەوەکانی نەوەی ئادەم بۆ خۆیەتی بەڵام بەتەنها ڕۆژوو بۆ خوای گەورەیەو خوای گەورەش خۆی پاداشتی بەندەکەی دەداتەوە لەسەر ڕۆژوو گرتنەکەی.

ڕۆژووی ڕەمەزان فەڕزە لەسەر هەموو کەسێکی باڵقی ژیری پێگەشتو، بەڵام ڕۆژووی منالٔ پاداشتەکەی بۆ دایك و باوکیەتی و دەبێت منالەکانمان ڕابهێنین لەسەر ڕۆژووگرتن تا لەداهاتوودا بتوانن بەڕۆژووبین.

# پایەی چوارەم
# (إِيْتَاءُ الزّكَاة) زەكات دان

پێناسەی زەكات: (الزَّكَاة): لە زمانی عەرەبدا بەواتای پاكێتی و گەشەپێدان دێت .

لە زاراوەی شەرعیشدا: بریتیە لەو بڕە سامانەی كە خوای گەورە پێویستی كردوە لەسەر دەوڵمەندان، كەوا بیدەن بەو كەسانەی شایەنی زەكات پێدانن، كە لەشەرعدا دەستنیشان كراون .

## گرنگی زەكات لەئیسلام دا

زەكات دانی ماڵ وسامان سێیەم پایەی گرنگی ئیسلامە پاش شایەتمان ونوێژ، لە زۆر شوێنی قورئان وسوننەتدا لەگەڵ یەكخواپەرستی ونوێژدا پێكەوە باسكراوە.

خوای گەورە دەفەرموویێت: (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ)[البينة: ٥]

واتە: وە ئەوان _ ئەهلی كیتاب _ فەرمانیان پێ نەكرابو تەنها بەوە نەبێت كەوا بەندایەتی خـوای گەورە بكەن وبەڕاستی وپاكی ئاین پەروەری هەر بۆ ئەو بكەن ، ولە هەمو ئاین وڕێبازێكی تر لادەن بۆ تاكە ڕێبازی ئیسلام، وە بە ڕێكوپێكی هەڵسن بە كردنی نوێژەكانیان، وە

زەکاتی ماڵ وسامانەکانیان بدەن، وهەر ئەوەش ئاینی راستەقینەی خوای گەورەیە.

هەروەها دەفەرموویێت: (وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ)[البقرة: ٤٣] واتە: وە نوێژەکانتان بەڕێکوپێکی ئەنجام بدەن، و زەکاتیش بدەن، ولەگەڵ کڕنوش بەرانیشدا کڕنوش بەرن .

هەروەها دەفەرمێ: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) [التوبة: ١٠٣] واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ وسامانی باوەڕداران زەکات دەربێنە، چونکە دەبێتە هۆی خاوێن کردنەوەی ماڵەکانیان وپاک کردنەوەی دڵ ودەروونیان .

زەکات هێندە گرنگە هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ نوێژدا پێکەوە بەیعەتی لەسەر وەرگرتوە، هەروەك جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خوای لێ رازی بێت) کەوا فەرموی: ( بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيْتَاءِ الزَّكَاةِ وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِم) رَوَاهُ البُخَارِي(٣/رَقَم/١٤٠١) وَمُسْلِم(١/رَقَم/٥٦)] واتە: بەیعەتم بەپێغەمبەری خوا دا ﷺ لەسەر: هەستان بە ئەنجامدانی نوێژەکان ، وزەکات دانی ماڵ وسامان ، وئامۆژگاری کردنی هەموو مسوڵمانێك .

## پاداشتی ئەوانەی زەکات دەدەن لای خوای گەورە

خــوای گەورە وپێغەمبەرەکـــەی ﷺ وەسفی زەکات دەران دەکەن وموژدەی پاداشتێکی چاکی دوارِۆژیان پێدەدەن.

لەسەرەتای سورەتی بەقەرەدا خوای گەورە بە پێنج ئایەت باسی سیفاتی باوەڕداران دەکات وەك دەفەرمووێت: (ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ () الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ () وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ( ) أُولَٰئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ [البقرة: ٢ – ٥]

واتە: ئەو قورئانە کتێبێکە هیچ گومانێکی تێدا نیە، ڕێپیشاندەرە بۆ پارێزگاران. ئەوانەی باوەڕیان بە پەنهانێکان هێناوە ونوێژەکانیان بەرێکوپێکی دەکەن ولەو رۆزیەی پێمان داون دەبەخشن . وە ئەوانەش کەوا باوەڕ دێنن بەوەی بۆ تۆ دابەزیوە وبەوەشی کە لەپێش تۆ دابەزیوە و دڵنیایی تەواویشیان هەیە بەڕۆژی دوایی. بەڕاستی ئەوانە لەسەر ڕێنموایین لە لایەن پەروەردگاریانەوە، وهەر ئەوانە خۆیانن سەرفرازبووەکان.

هەروەها لە باسی سیفەتی ئەو باوەڕدارانەدا کە دەچنە ناو بەهەشتی فیردەوسەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ﴾ [المؤمنون: ٤] واتە: وە یەکێکی تر لە سیفەتی ئەوانە، ئەوەیە کە زەکاتی ماڵەکانیان بەڕێکوپێکی دەردەکەن .

هەروەها دەفەرموێت: وە ئەو ماڵ وسامانەی کە بەزەکات دەیدەن ومەبەستان پێی ڕەزامەندی خوایە، ئا ئەوانەیە ماڵەکانیان چەند جار زیاد دەکات (ئەمە هەر لە ژیانی دونیادا، بێجگە لەو هەمو پاداشتەی کە لە دوارۆژیشدا بۆیان ئامادە کراوە) .

وە لەفەرموودەیەکیش دا کە ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێت) دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (مَنْ تَصَدَّقَ بِعدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ ــ وَلاَ يَقْبَلُ اللهُ إِلاَّ الطَّيِّبَ ــ وَإِنَّ اللهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِيْنِه، ثُمَّ يُرَبِّيْهَا لِصَاحِبِهِ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الجَبَلِ) [رَوَاهُ البُخَارِي(٣/رَقَم/١٤١٠) وَهَذَا لَفْظُهُ، وَمُسْلِم(٢/رَقَم/١٠١٤) وَغَيْرهمَا] واتە: هەرکەسێک بە ئەندازەی دەنکە خورمایەك لەکاسبی پاك وحەڵاڵی خۆی ببەخشێت ( وە خوای گەورەش تەنها پاك وحەڵاڵ وەردەگرێت) ئەوە خوای گەورە بەدەستی راستی خۆی وەریدەگرێت ، پاشان بۆ خاوەنەکەشی پەروەردەی دەکات، هەر وەکو چۆن یەکێکتان بەچکە ئەسپەکەی پەروەردە دەکات، تا ئەوەندەی کێوێك گەورە دەبێت .

## حوکمر و سزای ئەوانەی کەزەکات نادەن لەئیسلامدا

حوکمی زەکات نەدەر بێباوەڕبون ولە ئیسلام دەرچونە ئەگەر باوەڕی پێ نەبێت، بەڵام ئەوەی باوەڕی پێ هەبێت ونەیدات ، ئەوە دەسەڵاتدارێك کەحوکم بەشەریعەتی ئیسلام بکات بەزۆر لێی دەسێنێت ونیوەی ماڵەکەشی دەبات ،وەك سزادانێک دەبێت بۆی ، جا ئەگەر هەر نەیدا ودەستیشی دایە چەك ، ئەوە جەنگی لە گەڵدا بەرپا دەکرێت هەروەك چۆن خەلیفەی یەکەمی ئیسلام پێشەوا ئەبوبەکری سدیق (خوای لێ رازی بێت) جەنگی بەرپاکرد لەگەڵ ئەوکەسانەی پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵگەڕانەوەو زەکاتیان نەداو ئەوجەنگەش ناونرا جەنگی هەڵگەڕاوەکان.

وە زانایانی ئیسلام یەکڕان لەسەر ئەوەی: کەوا هەرکەسێک باوەڕ بە زەکات دانی ماڵ وسامان نەبێت ، ئەوە بێباوەڕە ولە ئیسلام دەردەچوە .

جا هەندێک لە زانایان فەرمویانە: هەرکەسێک واز لە یەکێک لەپێنج پایەکانی ئیسلام بێنێت بەقەستەوە، ئەوە بێباوەڕە ولە ئیسلام دەردەچێت، ئیتر باوەڕی پێی هەبێت یان نەء، وە هەندێك لە زانایان یەکڕایی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بێباوەڕبونی زەکات نەدەر دەگێڕنەوە .

له فەرمووده‌یه‌کدا که‌بوهزی کوڕی حه‌کیم (خوای لێ رازی بێت) بۆمان ده‌گێڕێته‌وه له‌باسی زه‌کاتی حوشتردا فه‌رموی: بیستم پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی: (مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِراً بِهَا فَلَهُ أَجْرُهَا ، وَمَنْ مَنَعَهَا فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ مَالِهِ ، عزْمَةً مِنْ عَزَمَاتِ رَبِّنَا عَزَّ وَجَلَّ ، لَيْسَ لِمُحَمَّدٍ وَلاَ لآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ) [رَوَاهُ أَبُودَاوُد(٤/رَقَم/١٥٦٠) وَأَحْمَد(٢٨/٢١٧/٨] واته: جا هه‌رکه‌سێک زه‌کات بدات وداوای پاداشت له خوای گه‌وره بکات، ئه‌وه خوا خۆی پاداشتی ده‌داته‌وه ، به‌ڵام هه‌رکه‌سێک نه‌یدات، ئه‌وه ئێمه به‌زۆر لێی ده‌سێنین و نیوه‌ی ماڵه‌که‌شی ده‌به‌ین مافێکه له مافه‌کانی په‌روه‌ردگارمان ، هیچی بۆ موحه‌ممه‌د وکه‌سوکاری موحه‌ممه‌د نیه .

خوای گه‌وره و پاشان پێغه‌مبه‌ره‌که‌شی ﷺ هه‌ڕه‌شه‌ی سه‌خت له زه‌کات نه‌ده‌ران ده‌که‌ن به سزایه‌کی زۆر سه‌ختی دوواڕۆژ.

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ( ٣٤ ) يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ [التوبة: ٣٤ – ٣٥]

واته: وه ئه‌وانه‌ی که‌وا ئاڵتون وزیو وپاره وپوله‌کانیان هه‌ڵده‌گرن وگه‌نجینه‌ی ده‌که‌ن وله‌پێناوی خوای گه‌وره‌دا لێی نابه‌خشن، ئه‌وه موژده‌ی سزایه‌کی به‌ئازاریان بده‌رێ . له ڕۆژێکدا که له‌ناو ئاگری دۆزه‌خدا بۆیان سور ده‌کرێته‌وه ، جا روومه‌ت وقه‌برغه وپشتیانی پێ داخ

دەکرێت، وپێیان دەڵێن: ئەمە بو کەوا هەڵتان دەگرت ودەتانکرد بە گەنجینە بۆ خۆتان، دەی ئەمڕۆ لە سزاکەی بچێژن .

هەروەها لەفەرموودەیەکدا ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: (مَامنْ صَاحب ذَهَب وَلاَ فضَّة لاَ يُؤَدِّي منْهَا حَقَّهَا ، إلاَّ إذَا كَانَ يَوْمُ القيَامَة ، صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائحَ منْ نَارٍ ، فَأُحْميَ عَلَيْهَا في نَار جَهَنَّمَ فَيُكْوَى بهَا جَنْبُهُ وَجَبيْنُهُ وَظَهْرُهُ كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعيْدَتْ لَهُ ، في يَوْم كَانَتْ مقْدَارُهُ خَمْسيْنَ أَلْفَ سَنَة، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ العبَاد ، فَيُرَى سَبيْلَهُ إمَّا إلَى الجَنَّة وَإمَّا إلَى النَّار ، قيْلَ : يَارَسُوْلَ الله! فَالإبلُ ؟ قَالَ: وَلاَ صَاحبُ إبلٍ لاَ يُؤَدِّي منْهَا حَقَّهَا)[رَوَاهُ مُسْلِم(٢/رَقَم/٩٨٧)]

واتە: هیچ خاوەن ئاڵتونێك نیە یان هیچ خاوەن زیوێك نیە کەوا ماف وهەققی خوای گەورەی لێنەدات ، ئیللا کاتێك کە رۆژی قیامەت دێت پارچەی ( وەکو ئەو ئاڵتون وزیوانەی دونیای) لە ئاگر بۆ دروست دەکرێت ، جا لە ناو ئاگری دۆزەخدا گەرم دەکرێت ، پاشان دەم وچاو وقەبرغە وپشتیانی پێ داخ دەکرێت ، هەر کاتێك سارد ببێتەوە ، بۆی دوبارە دەکەنەوە ، لە رۆژێکدا کە درێژێکەی پەنجا هەزار ساڵە ، تا دادگایی لەنێوان بەندەکاندا دەکرێت ، پاشان رێگای خۆی پێ پیشان دەدرێت یان بەرەو بەهشت، وە یان بەرەو دۆزەخ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی کەسێك خاوەن حوشتر بێت ؟ فەرموی: هەروەها خاوەن حوشتریش ئەگەر ماف وهەققی خوای لێنەدات سزای زۆر سەخت دەدرێت ..

## کێن ئەوکەسانەی کەزەکاتیان پێ دەدرێت

ئەو کەسانەی کە زەکاتیان پێ دەشێ و شایەنین خوای گەورە لە یەك ئایەت باسی کردوون: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ).[التوبة : ٦٠]

واتە : بێگومان زەکات تەنها بۆ نەداران و هەژارانە ، وە بۆ ئەوانەشی کە زەکات کۆ دەکەنەوە و دابەشی دەکەن، وە بۆ ڕاکێشانی دڵی ئەو کافرانەی کە ئومێدی هۆگر بوونیان پێ دەکرێت بۆ ئیسلام، وە بۆ ئازادکردنی کۆیلە ، وە بۆ قەرزداران ، وە لە پێناوی خوا ، وە بۆ ڕێبواران، بڕیارێکی بڕاوەی خوایە و خواش زانا و دانایە.

لەم ئایەتە تەنها هەشت جۆر کەس دیاری کراوە کە شایەنی زەکاتن:

١- نەدار [الفقیر]: ئەو کەسەیە کە ئەوەندە دارایی پێ نییە پێویستییەکانی ژیانی خۆی خێرانەکەی دابین بکات ، ئەم جۆرە کەسانە شایەنی ئەوەن زەکاتیان پێ بدرێت .

٢- هەژار [المسکین]: ئەو کەسەیە کە نیوەی پێویستییەکانی ژیانی خۆی و خێزانەکەی پێ دابین دەکرێت ، ئەمیش شایەنی زەکات پێ دانە.

٣- ئەوانەی کار لەسەر زەکات دەکەن [العاملون علیها]: ئەو کەسانەن کە زەکاتی زەنگینەکان کۆ دەکەنەوە و دابەشی دەکەن بەسەر ئەوانەی کە شایەنن.

٤- بۆ ڕاکێشانی دڵەکان [المؤلفة قلوب]: ئەویش بۆ ڕاکێشانی دڵی ئەو بێباوەڕانەیە کە ئومێدی ئەوەیان لێ دەکرێت ببن بە موسڵمان، یان باوەڕیان هەیە بەڵام باوەڕ لاوازن ، یان بۆ لابردنی زیانێک لە زیانەکانیان.

٥- بۆ ئازادکردن [في الرقاب]: ئەمەش بۆ ئەو کۆیلە موسڵمانانەیە کە خێریان تێدایە بۆ ئیسلام و موسڵمانان بە پارەی زەکات ئازاد دەکرێت لە خاوەنەکەی، هەروەها بۆ دیلی موسڵمانانیش دەشێت کە بە دیل گیراوە لە وڵاتی دووژمنان .

٦- بۆ قەرزداران [الغارمون]: ئەمەش ئەو کەسە دەگرێتەوە کە پێویستی بە بڕێك پارە هەبووە و قەرزی کردووە، یان بۆ چاکخوازی لە نێوان دوو کەس یان دوو کۆمەڵێ قەرزدار بووە، ئەم جۆرە کەسە زەکاتی پێ دەشێت .

٧- لە پێناوی خوا [في سبيل الله]: ئەمەش مەبەست پێی تێکۆشەرانن لە پێناوی خوا کە دەچن بۆ جەنگ لە پێناوی خوا وە هیچ مووچەیان نییە ، ئەم جۆرە کەسانە زەکاتیان پێ دەشێت .

٨- ڕێبوار [إبن السبيل]: ئەمەش ئەو کەسەیە کە ل جێ و شوێنی خۆی دوور کەوتۆتەوە و پارەی پێویستە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ، ئەم جۆرە کەسە زەکاتی پێ دەشێت ئەگەر نەیتوانی قەرز بکات لە کەسێك.

## پایەی پێنجەم
## (حَجُّ البَيْتِ إنِ استَطَاعَ إلَيْهِ سَبِيْلاً)
## حەجکردنی ماڵی خوا ئەگەر توانای هەبوو

پێناسەی حەج:

(الحَجّ) لە زمانی عەرەبدا بە واتای قەست ومەبەست دێت .

لە زاراوەی شەرعیشدا واتە: ڕوکردنە ماڵی خوا بە مەبەستی خواپەرستی وبەجێهێنانی دروشمەکانی حەج .

حەجی ماڵی خوای گەورە پێنجەمین پایەی ئیسلامەو فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی خاوەن توانا کەوا لە ژیانیدا یەك جار حەجی ماڵی خوای گەورە بکات لە شاری مەککە، گەورەترین حیکمەتیشی ئەوەیە کەوا بەفەرمانی خوای گەورە ساڵانە چەندین ملوێن کەس لەسەرانسەری جیهانەوە بەڕەشو سپی و جۆرەها نەتەوەو زمان لەماڵەکەی کۆدەکاتەوە، ئاواش دەتوانێت لەڕۆژی دوایی دا سەرجەم دروستکراو بونەوەر کۆبکاتەوە.

خوای گەورە کە دەفەرموێت: (إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ( ) فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ) [آل عمران: ٩٦ – ٩٧] واتە: بەڕاستی یەکەم ماڵێ کە دانراوە بۆ ئادەمیزاد (وئامادە کراوە بۆ خواپەرستی کردنیان) ئەوەیە کە لە مەککە دایە ، پیرۆز کراوە ، ورێنمایی وهیدایەتی تێدایە بۆ هەمو جیهان.

لەوماڵەدا چەند بەڵگە ونیشانەیەکی رون وئاشکرا هەن کە بەڵگەن لەسەر گەورەیی وپایەبەرزی ئەو ماڵە ، لەوانە شوێنی وەستانەکەی پێغەمبەر ئیبراهیم کە دەچوە سەری وبینای کەعبەی دەکرد ، جا هەرکەسێک چوبێتە ناوی ئەو ماڵەوە ، ئەوە هەمیشە دڵ ئارام بوە ، هەققی خوایە لەسەر خەڵکی کەوا حەجی ئەو ماڵە بکەن ئەگەر توانایان هەبو ، وهەرکەسێکیش باوەڕ نەهێنێ ئەوە خوای گەورە دەوڵەمەندە وبێنیازە لە هەمو جیهان .

لە فەرمودەیەکدا کە ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێت) بۆمانی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (أَيُّهَا النَّاسُ ! قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُمُ الحَجَّ فَحُجُّوا. فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ؟ يَارَسُولَ اللهِ! فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلاثاً فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَو قُلْتُ نَعَم لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ) [رَوَاهُ مُسْلِم(٢/رَقَم/١٣٣٧) وَالنَّسَائِي(٥/١١٠)] واتە: ئەی خەڵکینە ، بەڕاستی خوای گەورە حەجی لە سەرتان فەرز کردوە، جا ئێوەش حەجی ماڵی خوا بکەن . پیاوێک وتی : هەمو ساڵێک ئەی پێغەمبەری خوا ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو ، تا کابرا سێ بارەی کردەوە ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەگەر بیڵێم بەڵێ ، ئەوە لەسەرتان پێویست دەبێت و ناشتوانن بەجێی بێنن .

هەروەها لەبەر فەرمودەکەی تری ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێت) دەڵێت: کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (العُمْرَةُ إلى العُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالحَجُّ المَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الجَنَّةُ)[رَوَاهُ البُخَارِي(٣/رَقَم/١٧٧٣) وَمُسْلِم(٢/رَقَم/١٣٤٩)] واتە: عومرە بۆ عومرەیەکی تر دەبێتە هۆی داپۆشینی تاوانەکانی نێوانیان ، وە حەج کردنێکی پاک کەتاوانی تێکەڵ نەبوبێت پاداشتەکەی تەنها بەهەشتە .

هەروەها فەرمودەکەی تری ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێت) دەڵێت: کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (مَنْ حَجَّ لِلَّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَ لَمْ يَفْسُق، رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ) [رَوَاهُ البُخَارِي(٣/رَقَم/١٥٢١) وَمُسْلِم(٢/رَقَم/١٣٥٠)]
واتە: هەرکەسێک تەنها لەبەر خاتری خوای گەورە حەج بکات، وهیچ قسەیەکی خراپ وکارێکی خراپی تێدا ئەنجام نەدات، ئەوە ئەو کەسە لە تاوانەکانی پاک دەبێتەوە وەکو ئەو رۆژەی تیایدا لەدایک بوە .

# حوكمی ئەوكەسەی كەتوانای هەیەو حەج ناكات لەشەریعەتی ئیسلامدا

زانایانی ئیسلام دەفەرموون: هەركەسێک باوەڕی بە حەجكردن نەبێت ئەوە بێباوەڕە ولە ئیسلام دەردەچێت، بەڵام ئەوەی توانای هەبێت وحەج نەكات وتواناشی هەبێت ، ئەوە زۆر تاوانبارە.

هەربۆیە زانایانی ئیسلام هیچ جیاوازیەكیان لەوەدا نیە كەوا ئەو كەسەی باوەڕی بە فەڕزبونی حەج نەبێت بێباوەڕە ولەئیسلام دەرچوە ، بەڵام ئەو كەسەی نەیكات وباوەڕیشی پێ هەبێت ، ئەوە لە كافر كردنیدا زانایان جیاوازن، والله اعلم بالصواب.

سوپاس بۆ ألله سبحانه وتعالی تەواوبوو

## لە کۆتاییدا:

سوپاس بۆ (ألله) سبحانه وتعالی کەدەرفەتی پێ بەخشیم پێش مردنم هەردوو پایەکانی ئیمان و ئیسلام بەشیوەی تێگەشتنی منداڵان و گەنج و لاوەکان بەسود وەرگرتن لەچەندین کتێب و نوسراوو بابەتی بەسودو شەرعی ئامادە بکەم بەو هیوایەی ببێتە جێی ڕەزامەندی خوای گەورەو پاشان منداڵانی باوەڕداریش سودمەند بن لێی.

وە داواکارم لەخوای گەورە بیکاتە تووێشوی قیامەتمان و پاداشتی خێری سەرجەم ئەو زاناو مامۆستاو بانگخوازانش بداتەوە کەسوود مەندبووم لە نوسراوەکانیان لەهەڵەو کەم و کوڕی یەکانی منیش ببورێت.

اللهم امین.

(وسبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله الا أنت استغفرك وأتوب اليك)

بەندەی بچوکی هەمیشە موحتاجی(ألله) سبحانه وتعالی

ڕەنجدەر کوردی

تێبینی: مافی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە بۆ هەموو موسڵمانێکە

**سودمەند بووم لەم سەرچاوە بەسودانە:**

**١- پوختەی پایەکانی ئیمان نوسینی کاوان کوردی.**

**٢- پوختەی بیرو باوەڕو عەقیدە بە بەڵگەی قورئان و فەرموودە بەرگی یەکەم نوسینی مامۆستا طارق حسن هەمەوەندی.**

**٣- ئیمان نوسینی دکتۆر محمد نعیم یاسین.**

**٤- نیشانەکانی قیامەت نوسینی مامۆستا هاوڕێ محمد أمین.**

# ناوەڕۆك